**بەشی دووەمی سیماو سیفەتەکانی خەواریج؛ لە کتێبی "الخراسانیة"دا – ڕاڤەی عەقیدەی ئیمامی أبو حاتم وأبو زورعەی ڕازی ...**

# | سیفەتی خەواریج وسیما تایبەتەکانیان

شێخی فەرموودەناس؛ عبد العزیز الطریفی |
و: عبد الحکیم ڕەحیمی | گزنگ

**بە هۆی ئەوەی خەواریج کۆمەڵ دەستەو گروپێکی فراوان بوونەو، وەکو زۆر لە دەستەو گروپەکانی تر هیچ ئەسڵ ومەرجەعێکی نووسراویان نەبووە مرۆڤ بتوانێ سەیریکات وبەڵگەی لێ وەرگرێت وجێگەی متمانە وباوەڕپێکران بێ، یا خۆیان چ پێشەواو خەڵکانی تایبەتیان چ هەڵگرانی ئەو بیر وباوەڕە چاوی پێ بگێڕن وپشتی پێوە ببەستن وڕاڤەو لێکدانەوەی بۆ بنووسن، زانایان جیاوازییەکی زۆریان لە خەواریج وسیما وسیفەت وحوکمیاندا باس کردووە. خەواریج بە شێوەیەکی گۆشەگیرانەوە هەوڵیانداوە سەیری بەڵگەو دەقەکان بکەن وبە تێگەیشتنی خۆیان بیانخوێننەوە، بەو جۆرە تەنها دەق پیرۆزی لە لای خەواریجدا هەبووە وڕاو بۆچوونی سەلەف وزانایانیان لا بێ ئەرزش بووە، ئیتر هەر خۆیان وئەو جۆرەی لە وەحی وکەلامی خواو پێغەمبەر حاڵی بوو بوون مابوونەتەوە، بۆیە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم کە باسیاندەکا، ئەو فریوخواردنەیان بە سەیرکردنی گۆشەگیرانەی کتێب وسوننەت باسدەکا – کە دوو بنچینەی سەرەکی دین وباوەڕی موسوڵمانانن – دوور لە دید وتێگەیشتنی سەلەف وپێشینی ئەم ئوممەتە وپێشەوایانی. لەبەر ئەوەیە کە ئەبینی خەواریج لە فەهم وتێگەیشتنی سەلەفەوە هەڵاتبوون، بەڵام لەولاوە کەوتنە چاڵی فەهم وچەشنە حاڵی بوونی خۆیان وهەواو ئارەزووەکانیان.**

ئەگەر باسی سەیرکردنی ئەسڵی یەکەمیان بکەین، واتا خوێندەنەوەی ناهۆشیارانەیان بۆ قورئان وکەلامی خوای پەروەردگار، زۆر بە ڕوونی لە فەرموودەو باسی پێغەمبەردا دیارە صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: "قورئان دەخوێننەوە، بەڵام لە چەڵەمەی سنگیانەوە خوارتر ناچێ"، ئەم فەرموودەیەش فەرموودەیەکی صەحیحە ولە لای ئیمامی بوخاری وموسلیمدا لە گێڕانەوەی "ئەبو سەعیدی خودری"یەوە هاتووە.

ئەگەر باسی سەیرکردنی ئەسڵی دووەمیشیان بکەین، واتا خوێندنەوەی ناهۆشیارانەیان بۆ سوننەت وفەرموودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەوا دیسان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە ڕوونی ئاماژەی بەوە کردووە کە دەفەرموێت؛ "يَقُولونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ الْبَرِيَّة، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلام" - ئەوەی باشترین مرۆڤی سەرزەوی فەرموویەتی دەیڵێنەوە، بەڵام سەرگەردانن وياغییانە لە ئیسلام دەرەچن.

بۆیە کۆمەڵێك زۆر تەئویل ولێکداناوەی جیاجیایان تۆمار کردووە. وە چونکە هەر یەکە لێکدانەوەیەکی جیا لە هاوڕێکەی تری هەبووە؛ کار وکردارەکانیان لەو پەڕی ناشرینی وقێزەونیدا بوونە.

هۆکاری ئەوەی زۆربەشیان کتێب ومەزهەب وڕێچکەیەکی نووسراویان نەبووە کە بوترێتەوە وپشتی پێوە ببەسترێ، ئەوەیە کە گەورەکردن وڕێزلێنانی سەرۆك وپێشەواو زانایانیان زۆر پێ قورس بووەو، بەردەوام هەوڵیانداوە جگە لە کاتی شەڕ وجەنگدا پێشەنگ وپێشەوای تایبەت بە خۆیان دروست نەکەن، نەوەك ڕۆژێك بێت وحوکم وبڕیارێکی پێچەوانەی حوکمی خوا قەراردەن وبە هۆی پێشەنگی وپێشەوایەتیانەوە خەڵك وەدوایان کەون وبە قسەیان بکەن، لە ڕاستییەکەشدا ئەوان بە زوبان ئەو قسانە ناکەن، بەڵام ئاشکرا لە وەزع وسیما وحاڵ وبارياندا دیارەو، بۆیەش هیچ زانا وکتێب ونووسراوەیەکیان نییە.

خەواریجیش لێرەداو لە باسی ئیمامەت وپێشەنگێتیدا رێك پێچەوانەی ڕافیزەن، چونكە ڕافیزە تا سەر ڕێز وگەورەیی ئیمام وپێشەواكانیان ڕادەگرن وبە پیرۆزیان دەزانن، بەڵام زانا وپێشەوا هیچ فەزڵ وئەرزشێكیان لە لای خەواریجدا نییە.

سیفەت وسیماكانی خەواریجیش بە شێوەو شێوازی جۆراو جۆر لە سونەتدا باس كراون، بە گشتیش لە دوو جۆر سیفەتدا كۆ دەبنەوە:

- جۆری یەكەم: كۆمەڵە وەسفێكی پەیوەستن وەكو خوویەكی بەردەوامی ئەو خەڵكەن، كە لە دوو وەسفدا بەرجەستە دەبن :-

| یەكەمیان: تەكفیر كردنی خەڵكە بە كردارهایەك، كە لە شەریعەتدا هۆكاری كافر بوونەوەو تەكفیر كردن نین.

| دووەمیان: ئەوەیە كە بە پێی ئەو تەكفیر كردنەوە، خوێنڕشتنی نەیارانیان بە ڕەوا حەڵاڵ دەزانن.

كۆی ئەم دوو وەسفەش لە فەرموودەی پێغەمبەردا دەرەكەوێ صلى الله عليه وسلم كە دەفەرموێت: "يقتُلون أهل الإسلام، ويدعونَ أهلَ الأوثان" - خەڵكی ئیسلام دەكوژن، وخەڵكی بت وپەیكەر ودروستكراوەكان وێڵ دەكەن - هۆكارەكەشی ئەوەیە ئەوان سەرەتا تەكفیری موسوڵمانان جێگیر ئەكەن، دوای ئەوە دێن شەڕ وكوشتاریان لەگەڵدا دەكەن.

بنچینەی یەكەمیان لەو شوێنەدا دەرەكەوێت، كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: "يمرُقونَ مِنَ الدّين" - یاغیانە وسەرگەردانانە لە دین دەرەچن - ئیتر كە خۆیان بەو چەشنە لە دینەوە دەرچوونە، وایان خەیاڵكردووە ئەو خەڵكەی تر دەرچوو وسەرگەردانن بۆیە – لەبەر ئەوەی بە یاغی وسەرگەردانیان زانیون – زوو تەكفیریان كردوون ولە دینیان كردوونە دەرەوە.

بنچینەی دووەمیشیان لەو شوێنەدا دیارە كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: "ئەهلی ئیسلام ئەكوژن"، ئەمیش وەسفێكی ئاشكرا وڕاشكاوانەی ئەو خەڵكەیە.

بۆیە پێشەواكانی سەلەف خەواریجیان بەو دوو ئەسڵ وبنچینەوە ناسیوە، كە بۆ نموونە مەیموونی كوڕی میهران دەفەرموێ: "ئەزانی حەرووری ئەزرەقی كێیە ؟ ئەو كەسەیە كە ئەگەر پێچەوانەی ئایەتێكی قورئانت كار كرد، ئەڵێ تۆ كافریت وخوێنت بە حەڵاڵ ئەزانێ" !

بۆ چی باسی ئەوەشمان كرد كە خەواریج خەڵك بە شتانێك تەكفیر دەكەن كە هۆكاری شەرعی كافر بوونەوەو تەكفیر كردن نین، چونكە خەواریج نە لە ئەسڵی تەكفیر كردنی خەڵك بە هۆی ئەنجامدانی گوناه وتاوانی گەورەو، نە بە گوناه وتاوانی بچووك وتەنانەت بە ئەسڵی تاوانیش لە شەریعەتدا؛ لە مەسەلەی تەكفیر كردندا هاوڕا نین؛

بۆ نموونە دەستەی "نەجەدات"یان خەڵك لە بارێكدا تەكفیر دەكەن كە سووڕ بن لەسەر ئەنجامدانی گوناهێكی بچووك یا گەورە، بەڵام كەسێ جارێك زینا یا دزی یا نێربازی بكات - تا سووڕ نەبێت وچەندین بار دووبارەی نەكاتەوە - تەكفیری ناكەن، لەولاشدا ئەگەر مرۆڤێك - با تاوانێكی بچووكیش بێت - دووبارەیكاتەوەو سووڕ بێ لەسەر ئەنجامدانی، بە كافری دەزانن ولە دینی دەكەنە دەرەوە. هۆكارەكەشی ئەوەیە كە ئەم دەستەیەی خەواریج سووڕ بوونی مرۆڤ لەسەر گوناه وتاوان بە نكووڵی كردن وپێچەوانەیی بڕواو ئیمانەوە دەزانن.

بەشێكی تری خەواریجیش — وەكو هەندێك لە دەستەی صوفرییەكان — تەنها دوای جێبەجێكردنی سزای گوناه وتاوانی گەورەوە خاوەنەكەی تەكفیر دەكەن، بۆیە ئەگەر دوو پیاو بۆ نموونە لەسەر یەك خواندا شەراب بنۆشن وتەنها یەكێكیان سزا بدرێت وحەدی ئەو گوناهەی بەسەردا بسەپێنرێ، ئەمیان تەكفیر دەكەن وئەوەكەی تر — كە

جارێ سزا نەدراوە – تا سزا نەدرێت وحەدی بەسەردا نەسەپێنرێ لە لای ئەوان بڕوادار وئیمانداره.

بەڵکو ئەگەر سەیرکەین دەبینین بەشێك لە خەواریج کۆمەڵێك هاوەڵیان – وەکو عەلی کوڕی ئەبو تالیب – بە کاری حەڵاڵو شەرعییەوە تەکفیر کردووە، ئەو کاتەی کە ئیمامی عەلی لە کێشەکەی لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا دوو هاوەڵی پێغەمبەری کردنە داوەر لە نێوان خۆی وموعاویەداو ، دیارە کە کردارەکەی شەرعی بوو وهیچ کێشەیەکی نەبوو، بەڵام چونکە خەواریج پێیان وابوو ئەو کارە تاوانەو داوەری کردنی غەیری خوای گەورەی پێوە دیارە، ئیمامی عەلی‌یان پێ تەکفیر کرد. بۆیە ئەسڵی بیر وباوەڕیان لە بابەتی تەکفیردا جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی؛ کە ئەوان خەڵك بە کار وکردارهایەك تەکفیر دەکەن کە هۆکار نین لە شەرعدا بۆ کافر بوونەوەو تەکفیر کردن.

ئەوانەی باسی ئیجماع ویەکڕایی زانایانیش سەبارەت بە بیروباوەڕی خەواریجدا دەکەن – وەك کەعبی، وشەهرستانی، وڕازی – گوایە خوو وەسفێکی نەگۆڕی خەواریجە کە خەڵك بە گوناه وتاوانی گەورەوە تەکفیر ئەکەن، لە حەقیقەتدا ڕاستی مەسەلەکەیان نەپێکاوە، لەوانەشە هەر وەکو ئیجماعێکی بەرجەستەکەری حاڵی خەواریجیان باس کردبێ لە سەردەمێکی تایبەتدا، یا لە دەستەو کۆمەڵێکی تایبەتی خەواریجداو، مەبەستی ئەوەیان نەبووبێ کە ئەمە ئەسڵێکی کۆکەرەوەو نەگۆڕی خەواریجە.

چونکە خودی ئیمام وپێشەواکانی موسوڵمانان ئاگاداری ئەوە هەبوونە کە بەشێك لە خەواریج خەڵك بە گوناهی بچووکیشەوە تەکفیر دەکەن، بۆ نموونە پێشەوا "أبو عبید القاسم بن سلام" دەفەرموێ: "چونکە ئەمە ڕێچکەو بیروباوەڕی ئەو خەواریجانەیە کە بە تەئویل ولێکدانەوەی خۆیانەوە لە دین سەرگەردان وياغی بوونە، هەر بۆیەش خەڵکیان بە گوناهی بچووك وگەورەوە تەکفیر کردووە"، بە هەمان شێوەش "ابن أبی زمنین" لە (أصول السنة) وغەیری ئەویش باسیانکردووە.

بگرە خەواریج لەوانەیە بە حەڵاڵ وبە چاکەشەوە خەڵك تەکفیرکەن، چونکە ئەگەری هەیە دەروازەی حەرام وگوناهێکی گەورە وبچووکی تێدا بدۆزنەوە. خەواریج بەردەوام لە تەفسیر ولێکدانەوەی گوناهدا بە هەڵەدا دەچن وزیاتریش لە لێکدانەوەی هۆکارەکانی کافر بوونەوەو تەکفیر کردندا تووشی هەڵەو پێ خلیسکان دەبن. گومڕایی خەواریج لەوەدایە کە خودی گوناه بە هۆکاری کافر بوونەوەو تەکفیر کردن دەزانن‌و، وەکو ئەهلی سوننەت بە گوناه وتاوانیان لێك نادەنەوە، بەڵکو بڕوایان وایە ئەو گوناهانە هەڵوەشێنەر وشکێنەری باوەڕ وئیمانن، وقەناعەتیان بەوە نایەت کە ئەمانە فەقەت گوناهن ومەرج نییە خاوەنەکەی بە کوفر بگەینن. بۆیە وەك چۆن ئەهلی سوننەت بڕوایان وایە کوفر وئیمان لە دڵی مرۆڤێکدا جێگایان پێکەوە نابێتەوە، ئاوەها خەواریج پێیان وایە ئیمان وتاوان لە مرۆڤێکدا کۆ نابنەوەو، تاوانەکان ئەدەنە پاڵ هۆکارەکانی کافر بوونەوەو تەکفیر کردنەوە.

ئەگەر ئەهلی سوننەتیش بێنە سەر باسی خەواریج وقسە لەسەر تەکفیر کردنیان بۆ خەڵك بکەن بە گوناهـ وتاوانی گەورە بە شێوەکی ڕەهاوە، ئەوە بە پێی لێکدانەوەی ئەهلی سوننەتە بۆ گوناه وتاوان، ئەگینا خەواریج - ئەگەر ناوی گوناهی گەورەش لە کردارێك بنێن - قەت بە تاوانێکی گەورەی خاڵی نازانن، بەڵکو دەیکەنە هاوەڵ وهاوڕێگەیەکی هەمیشەیی نکووڵ کردن.

گومڕایی خەواریج لەوەدایە کە بەستەرێکیان بە گوناهـ وتاوانەوە لە بیری خۆیاندا لکاندووە، کە مەرج نییە لە ڕاستیدا ئەنجامدانی گوناهــ وتاوان خاوەن ئەو گوناهە بەو لینکەی نێو خەیاڵیان بگەینێت، نە کەوتنە نێو حەرام مانای ڕەتدانەوەی حوکمی حەرامکردنی ئەو شتە ئەدات، نە واز لە واجب هێنانیش مانای ڕەتدانەوەو نکووڵی کردن لە حوکمی واجب بوونی ئەو ئەرکە ئەبەخشێت.

لە شوێنێکی تریشەوە لە تەفسیر ولێکدانەوەی گوناهــ ودیاری کردنیدا لە هەڵەدان. خەواریج لە سنوور وحەدی گوناە ومەرزی نکووڵی کردنەوە جیاوازن، تەنانەت بەشێکیان ڕیش تاشینیش بە گوناهێکی گەورە دەزانن‌و، بڕێك لە وتارخوێنە هاوچەرخەکانی

ئیباضیەكان ئەوەندەی تر سەختیان گرتووەو تەنانەت لێكردنەوەی تاڵە مووێكی ڕیشیش بە حوكمی تاشینەكەیوە دەبەستنەوەو، تاشینی ڕیشیش لە لای ئەواندا گوناه وتاوانێكی گەورەیە ویەكێكە لە هۆكار وسەبەبەكانی نكووڵی كردن وخاوەنەكەی پێی كافر دەبێتەوە.

بۆیە ئەبینی ئەگەرچی دەستەو كۆمەڵەكانی خەواریج لەو دوو ئەسڵەی پێشووشدا هاوڕا بن – كە تەكفیر كردنی خەڵكن بێ ئەوەی هۆكارێكی شەرعی كافر بوونەوەو تەكفیر كردنیان بێت وحەڵاڵ كردنی خوێنی ئەو خەڵكەیە – لە لق وپۆپ ودابەزاندنی حوكمەكانیان لە واقیعدا زۆر لێك جیاواز وهەمەجۆرن، سەیر دەكەی هەندێكیان كردارێكیان پێ كوفرە كەچی بڕێكی تریان بە كوفری نازانن، ئەوانەی تر شتێكی تریان پێ كوفرە ئەمان بە كوفری نازانن.

بۆیە هەموو دەستەكانی خەواریج كۆكن لەسەر تەكفیر كردنی خەڵكەوە بە كۆمەڵە كردارێك كە هۆكاری شەرعی كافر بوونەوەو تەكفیر كردن نین‌و، خوێنی بەرامبەرەكەیان بەو تەكفیر كردنە حەڵاڵ دەكەن. ئەوەی جیاوازیش بێتن لە نێوانیاندا لە دیاریكردن وتایبەتمەندییەكانی ئەو گوناهانەدایە؛ كە دەبنە هۆكاری كافر بوونەوەو تەكفیر كردن، تەنانەت هەتا ئەگەر ئەو كار وكردارانە لای خەڵكانی تر بە گوناه وتاوانیش دانەنرێن.

گومڕایی خەواریجیش لەم بابەتەدا دەگەڕێتەوە سەر لێك جیا نەكردنەوەی ئەسڵی دین و لق وپۆپەكانی‌و، تێكەڵ كردنی بابەتەكانی فیقهـ بە بابەت وباسەكانی عەقیدەوە. بەو شێوەیە بابەت ومەسەلەكانی فیقهـ تێدەكوشنە ناو بابەتی بیرو باوەڕ وعەقیدەوەو سەرەنجام ئاكامی هەڵەو نادروستیان دەست دەكەوێت.

مەسەلەیەكی تر ئەوەیە ئەگەر دەستەو كۆمەڵێكی تریش هاوئەسڵی خەواریج بن لەم بنچینەدا، ئەوا زانایان بەو تاكە وەسفە لە ڕیزی خەواریجیان قەرار نەداون، هۆكارەكەشی دوو شتە:

**یەکەم:** ئەوەی کە بەشێك لەو دەستەو کۆمەڵانە – وەکو موعتەزیلەکان بۆ نموونە، کە پێیان وایە مرۆڤی فاسیق وگوناهکەر بڕوادار وخاوەن ئیمان نییە – بە غەیری هۆکاری شەرعی کافر بوون وتەکفیر کردنەوە خەڵك کافر دەکەن، بەڵام ئەگەر چی هاوئەسڵی خەواریجیشن لێرەدا وەکو خەواریج خوێنڕشتنی ئەو خەڵکە بە حەڵاڵ نازانن، هەر ئەوەشە کە وەسفی خەواریج نایانگرێتەوە. بەڵام بڕێك لە سەلەف وپێشین – وەکو عبد الرحمن بن محمد بن القاسم الحسنی، بۆ نموونە - لەم گۆشەوە بە خەواریجە دانیشتووەکانیان وەسف کردوون، کە حەسەنی دەیفەرموو: "موعتەزیلە؛ خەواریجە دانیشتووەکانن، ئەوانە ناتوانن شەڕی شمشێر لەگەڵ خەڵکدا بکەن، بۆیە کەوتوونەتە شەڕ وجیهادی زوبان لە دژی خەڵکا".

**دووەم:** ئەوەی دەستەو گروپەکان بە پێی سیفەت وسیمای دیاری عەقیدەو بیر وبڕوایانەوە – نەك بە خاڵە پەنهان وشاراوەکانیان – وەسف دەکرێن. ڕافیزە – بۆ نموونە – هاوئەسڵن لەگەڵ خەواریجدا لە تەکفیر کردنی خەڵك بە هۆکاری ناشەرعییەوە ، بەڵام ڕافیزە بە کردار – ئەگەر بە زمانیش شتێکی تر بڵێن – تەواوی دین ڕەت دەکەنەوەو، لە خەواریج زۆر خراپترن. تەنانەت بڕێك دەستەو کۆمەڵی ڕافیزە چەمکی قەدەریش ڕەت دەکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا چونکە وەسفی ڕەفزیان زیاتر بەسەردا زاڵە، ناوی ڕافیزەیان هەر لەگەڵ ماوەتەوە.

ئەو دوو وەسفەش کە لە پێشوودا باسمان کردن؛ دوو وەسفی پەیوەستەی خەواریجن وبەردەوام لەگەڵیاندان، بۆیە هەر خاریجییەك قەناعەتی بە ئەسڵی یەکەمەوە بێت – واتا تەکفیر کردنی خەڵك بێ هۆکاری کافر بوونەوەو تەکفیر کردنی شەرعی – حەتمەن ئەسڵی دووەمیشی بە دوادا دێنێ – کە خوێن ڕشتن وخوێن حەڵاڵ کردنە – ، بەڵام مەرج نییە پێچەوانەی ئەم هاوکێشەیە دروست بێ:

بۆ نموونە ئەگەر خەواریج کەسێکیان تەکفیر کرد، دەستبەجێ خوێن ڕشتنی ئەو کەسەش حەڵاڵ دەکەن، بەڵام ئەگەری هەیە خوێنی کەسێك بێ تەکفیر کردنەوە

حەلالکەن، ئەو کات ئەسڵی دووەم بە کار دەبەن، بەڵام مەرج نییە بە پێی ئەسڵی یەکەمیان تەکفیری کەن.

هەر مرۆڤێکیش ئەو دوو ئەسڵەی تێدا کۆ بووەوە، ئەگەر بە کرداریش شەڕ وکوشتار وخوێن ڕێژی نەکا؛ بە خەواریج ئەژمار ئەکرێت. چون بڕێك خەواریج هەن بە هۆکاری جیا جیای وەك نەتوانین وسستی وترسەوە – وەکو بەشێکی خەواریجە ئیباضیەکان، کە خەڵك تەکفیر دەکەن وخوێنیشیان بە حەڵاڵ دەزانن، بەڵام دەستیان لە خوێنیان سوور ناکەن – واز لە شەڕ وخوێنڕێژی دێنن.

لەبەر ئەوەیە ئەیوبی سەختیانی ئەگەر لە موبتەدیعێکدا ئەو دوو ئەسڵەی پێکەوە بە دی کردبا؛ بە خەواریجی وەسف دەکرد ودەیفەرموو: "خەواریج ناو ونازاناوی زۆریان هەیە، بەڵام چەك وشمشێر گشتیان کۆدەکاتەوە".

## دووەم جۆری سیفەتەکانی خەواریج:

کۆمەڵە سیمایەکی پەیوەست وخوو سیفەت نین، بەڵام نیشانە وئاماژەی خەواریج بوونن، کە لەوانەیە لە سەردەمێکدا زەقتر دەرکەون ولە سەردەمانێکی تردا خاو بنەوە، وەك ئەو وەسفانەی لە فەرموودەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لە لای ئیمامی بوخاری وموسلیمدا لە گێڕانەوەی ئەبو سەعیدی خودرییەوە هاتوون کە دەفەرموێت: "وێڵی کە، ئەمە چەند ڕەفیق وهاوڕێیەکی هەن؛ ئەگەر کەسێکتان بیانبینێ نوێژ وڕۆژووی خۆی لە بەرامبەر نوێژ وڕۆژوو وعیبادەتی ئەوانەوە لەبەرچاو دەکەوێ، ئەوانە خەڵکێکن قورئان دەخوێننەوە بەڵام چەڵەمەی سنگیان تێپەڕ ناکا، چۆن تیرێك لە کاتی ڕەتبوونی لە نێچیرەکەیوە سەیری سەرەکەی دەکەیت، هیچی لەگەڵ خۆیدا نەبردووە، بە خوێن وگۆشتدا تێپەڕیوە، بەڵام هیچی بە خۆیەوە هەڵنەگرتووە، ئاوا لە دینەوە دەرەچن ویاغی وسەرگەردان ئەبن".

مەبەستیش لەو کۆمەڵە وەسفەی لەم فەرموودەدا بە یەکەوە باس کراون سەردەم وکاتێکی تایبەت ودیاریکراوە، بۆیە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - لە تەواوکەری فەرموودەکەدا دەفەرموێت: "نیشانەیان پیاوێکی ڕەش پێستە، کە یەکێك لە دەستەکانی وەکو سنگی ئافرەت وایە"، کۆی ئەو وەسفانەش بە یەکەوە شتێکی تایبەت بەو سەردەمە بووە.

بەڵام بەشێکی ئەو سیماو سیفەتانە، وەك ئەوەی قورئان بە نەفامی دەخوێننەوە وناگاتە چەڵەمەی سنگیانەوە، زەق لە هەموو سەردەم وسەربارێکی پەیابوونیاندا دیارە، چون ئەو خەڵکە ئەگەر لە قورئان گەیشتبان ولە دڵیاندا قەراری گرتایە، گومڕاو سەرگەردان نەدەبوون.

بەشێکی تری ئەو سیفەتانە چەند کردارێکی حەلالن وکێشەی تیا نییە مرۆڤێکی موسوڵمان ئەنجامیاندا؛ وەك سەرتاشین بۆ نموونە. بەشێکی تریان قەدەرن ومرۆڤ هەڵیان نابژێرێ؛ وەك تەمەن بچووکیان. بڕێکی دیکەیان کەم ڕەوشتی ولاواز بوونی باری ڕەفتار وئەخلاقە؛ وەك کەم عەقڵی وناحاڵێتی ودوابەدواکانی ئەم سیفەتە؛ کە سروشت وڕەفتار توندییان لا دروستدەکا.

دەستەیەکی تری ئەو سیفەتانە عیبادەت وپەرستش وکاری چاکەی وەك خوێندنەوەی قورئان وزۆر نوێژ کردنن، بەڵام خودی عیبادەت وپەرستنی خوای پەروەردگار تا لە مرۆڤێکی خراپ ومەزموومدا قەرار نەگرن وپاڵ بەو مرۆڤەوە نەدرێن؛ نابنە سیما ونیشانەی خراپەی بەندەیەك، پەس کە قورئان خوێندن وای لە مرۆڤ کرد خۆی بە زۆر زان بزانێت وبە زۆر عیبادەتەوە خۆی بە دیندار زانی، خودی ئەو سیفەتانە دەبنە نیشانەی بیدعەو داهێنانی لە دینداو، لە عیبادەت وچاکەو مایەی پاداشتەوە دەبنە ڕاکێشانی ئەو مرۆڤە لە لایەن خوای پەروەردگار، ئەمەش مەبەستی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: "قورئان دەخوێننەوە، بەڵام چەڵەمەی سنگیان تێپەڕ ناکا"، واتە: ناگاتە دڵیانەوە، چون ئەوەی بە دڵ ئەگا زانست وتێگەیشتن وحاڵی بوونەو دڵیش شوێنی ئەو تێگەیشتنەیە، بەڵام خوێندنەوەی پیت ودەنگ هەڵبڕین کاری

**زمانن وبەڵگەی ئەوەن کە خوێندنەوەکەیان تەنها دەنگ وتەرتیلێکی ناحاڵیانەیەو، بۆیە کاتێك کە ئایەتێك دەخوێننەوەو شوێنی تەئویل کردنی بێت، بە هەڵەدا دەڕۆن وسەریان لێ دەشێوێ، طاوس دەگێڕێتەوە دەڵێ: "لای ابن عباس باسی خەواریج وباسی قورئان خوێندیانم کرد، فەرمووی: ئەوانە بڕوایان بە ئایەتە موحکەم وئاشکراکانی هەیە، بەڵام کە گەیشتنە ئەو ئایەتانەی جێگەی تەئویل ولێکدانەوەی جیا جیایان هەیە، سەریان لێ دەشێوێ وتێدا گوم دەبن".**

## بۆیە دەبینی چەندین قەولی جیا جیایان لە کۆمەڵە حوکمێکی شەرعیدا هەیە:

**بۆ نموونە: بەشێکیان بڕوایان بە سڕینەوەی خوف نییە لە کاتی دەستنوێژدا.**

**بڕێکی تریان پێیان وایە ئافرەتی حائیضە ئەبێ تەواوی نوێژەکانی دووبارەوە قەزاکاتەوە.**

**ئەمەش لقێکی ئەو ئەسڵەی پێشووی خەواریجە، کە چاو لە حوکمە ڕوون وئاشکراکان ناگێڕن وپشت بەو حوکمانە دەبەستن کە دەروازەی تەئویل ولێکدانەوەی جیایان هەیە، بۆیە بەشێکیان لە ڕێی ئایەتەکەی سوورەتی مائیدەوە – کە ئەحکامەکانی دەستنوێژ دەخاتەڕوو – ئینکاری سڕینەوەی خوف لە دەستنوێژدا دەکەن، کەچی ئایەتەکەی سوورەتی مائیدە لە بابەتی دەستنوێژ گرتندا ئایەتێکی گشتییە ، ولە بەرامبەردا پشت لە سوننەتی ڕوون وئاشکرای پێغەمبەر لەم باسەدا دەکەن. بڕێکی تریان پێیان وایە ئافرەتی حائیضە چۆن ڕۆژووەکانی دەگرێتەوە، ئەبێ تەواوی نوێژەکانیشی قەزاکاتەوە، لە کاتێکدا ئەمە حوکمێکە شاراوەو نادیار وجێگەی گومانە وسوننەتی دیار وئاشکرای پێغەمبەر قەزا نەکردنەوەی نوێژی ئافرەتی حائیزەیە.**

**یەكێ لەو سیفەتانەی تری بڕێك لە دەستەو كۆمەڵەكانیان؛ بڕوا بوونیانە بە مەسەلەی خەلق ودروستبوونی قورئانو ئینكاری سوننەتی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم -، ئەم سیفەتەش وەكو خوو وپەیوەستەیەكی دائیمی خەواریج نییە، لەو خەواریجانەشدا نەبووە كە لە سەردەمی عەلی كوڕی ئەبو تاڵیبدا بوون وصەحابەو ئیمامی عەلی شەڕیان لەگەڵدا كردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر خەواریج بوون لە لای هاوەڵانی پێغەمبەر وتابیعینەكان. هۆكارەكەشی ئەوەیە كە ئەم وەسفانە وەسفێكی خوویی نین، ئەشێ هەبن وئەشێ نەبن.**

**وەسفی خوێندنەوەی قورئان وتێپەڕ نەبوونیشی لە چەڵەمەی سنگیانەوە، ئاماژەیەكە بە ناحاڵی وتێنەگەیشتنیان، وئەوەی تەنها لە ڕوخساری بابەتەكان دەگەن وماناكانیان ناپێكن، بەڵام مەرج نییە ئەم وەسفە لە تاك بە تاكی خەواریجدا بێت، چونكە بەشێكیان هەر نەخوێندەوارن وقورئان ناخوێننەوە، تیاشیانە ئەگەر چی نەخوێندەواریش نین بەڵام كەمتەرخەمن وبایەخ بە خوێندنەوەو لەبەركردنی قورئان نادەن.**

**ئەمە جیا لە تەكفیر وخوێنڕێژی كە وەسفێكی بەردوامی خەواریجەو لە گشتیاندا هەیە، چ تاك وچ كۆمەڵەكانیان بێو، ئەگەر لە تەكفیر كردنی كەسێكی تایبەتیشدا لێك جیا بن، بە هەر جۆرێك بێت خەڵكێكیان بێ هۆكاری تەكفیر كردن كافر كردۆتەوە وهەموویان تووشی ئەو دەردە بوونە.**

**لە بەرامبەردا بە كارهێنانی موتەشابیهەكان لە لایەن خەواریجەوە سیفەتێكی تایبەت بە خەواریج نییە، بەڵكو لە گشت دەستەو كۆمەڵە گومڕاكاندا هەیەو، خەواریج لێرەدا مەزیەتێكی زیاتریان بەسەر ئەو دەستانەی ترەوە نییە، بەڵام ئەم سیفەتە زەقتر لە خەواریجدا دیارە، چونكە خەواریج گەورەییەكی یەكجار زۆر بۆ دەقەكان دادەنێن، وهەر ئەوەشە كە پێیان قورسە یەكێك لە دەقەكان لە كارخەن ویاخود ئینكاری كەن، بۆیە پەنا دەبەنە بەر خستنییە نێو ڕیزی موتەشابیهەكانەوە ودەست بە لێكدانەوەو تەئویلی دەكەن.**